

زنجیرەی هاوەڵانی پێغەمبەر

حەوتەم

# عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف

(رضی الله عنه)

ئامادەکردنی: سەلمان تەوحیدی




KTEBXANAY TWESHW

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله الذي أمر بالجهاد في سبيله، ووعد عليه الأجر العظيم والنصر المبين، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له القائل في كتابه الكريم (وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نَصْرُ الْمُؤْمِنِينَ)الروم:٤٧ وأشهد أن محمدا عبده ورسوله وخليله قائد المجاهدين وأصدق المناضلين وأنصح العباد أجمعين ﷺ وعلى آله الطيبين الطاهرين، وعلى أصحابه الكرام الذين باعوا أنفسهم لله وجاهدوا في سبيله حتى أظهر الله بهم الدين وأعز بهم المؤمنين، وأذل بهم الكافرين رضي الله عنهم وأكرم مثواهم وجعلنا من أتباعهم بإحسان إلى يوم الدين.

زۆرجار ئێمەی موسڵمان بەشێکی ژیانمان تەرخان دەکەین بۆ خوێندنەوەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی و شوێنکەوتوانی، جاری وا هەیە لە بەشێکی ژیاننامەکەدا بەسەرهاتێك کارمان تێدەکات و هەوڵ دەدەین لە ژیانماندا بیکەینە چرایەك بۆ ڕووناککردنەوەی بەرپێمان، چونکە مرۆڤ زووتر لەگەڵ ڕووداوە واقعیەکانی ژیانی مرۆڤایەتیدا زیاتر کاریگەر دەبێت،

ئەم زنجیرەیە بەم مەبەستە نووسراوە، چۆن هاوەڵان بناسین و دیوەجوان و ڕازاوەکانی ناو ژیانی هاوەڵان شارەزابین و بتوانین پەند و وانەیان لێ وەربگرین و لە واقیعی ژیانماندا جێبەجێ بکەین.

ئەم شێوازی فێربوون و فێرکردنە لە قورئانەوە فێر دەبین، کاتێك خوای گەورە پاش گێڕانەوەی بەسەرهاتی پێغەمبەران، دەفەرمووێت: (لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِأُولِي الْأَلْبَابِ مَا كَانَ حَدِيثًا يُفْتَرَى وَلَكِنْ تَصْدِيقَ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ كُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ)يوسف. (سوێند بەخوا لەداستان و سەرگوزەشتەی یوسف و براکانیدا، گەلێ عیبرەت و ئامۆژگاریی مەزن هەیە، بۆ خەڵکانی هۆشمەندو ژیر کە بیکەنە ڕێ نیشاندەری خۆیان، بۆ دۆزینەوەی هەق و ڕاستی، دیارە کتێبێکی وەکو ئەم قورئانەش، هەرگیز ناشێ قسەوباسێکی هەڵبەستراو بێت، بەڵکو تەصدیق وپشتڕاستکردنەوەیە بۆ کتێبە پێشووەکانی بەرلەخۆی و شیکەرەوەی هەموو شتێکیشە، بەتەواوی بەیانی حەڵاڵ و حەرامی تێدایە و ڕێ نیشاندان و ڕەحمەت و میهرەبانی خوایە بۆ خەڵکێ بیەوێ باوەڕ بهێنێت).

بەویستی الله تعالی درێژە بەم زنجیرەیە دەدەین و هەولدەدین ژیانی زۆربەی هاوەڵان بلاو بکەینەوە بە چەند مەبەستێك:

یەکەم: بزانین کەسانێك توانییان خوا لە خۆیان ڕازیی بکەن، چۆن ژیان و چۆن توانییان ئەو ڕەزامەندییە بەدەست بهێنن.

دووەم: تێبگەین ئەزموونی پەیڕەوی پەیامی خوا ناواقیعی نیە و تەنها لە پێغەمبەری خوادا ﷺ سنووردار نەبووە، بەڵکو ئەم دینە واقیعیە و دەکرێت مرۆڤەکان پەیڕەوی بکەن، نموونەی یەکەمیشی لە هاوەڵاندا خۆی دەبینێتەوە.

سێیەم: کۆی ئەم دینەی ئێستا ئێمەی موسڵمان پێوەی پابەندین، لەلایەن هاوەڵانەوە بەدەستمان گەیشتووە، گرنگە شتێك لەبارەی ژیان و بیرکردنەوەو هەڵسوکەوتیانەوە شارەزا ببین، بزانین ئایا ئەم پەیامەمان لە کەسانی سەرڕاست و ژیرەوە وەرگرتووە؟ یان تەمەنێکە لەخشتەبراوین و بە ناحەق پابەندی ئایینێك کراوین کە کەسانێك بە ویستی خۆیان دایانڕشتووەو سەپاندوویانە.

لەم نووسینەدا، تەنها چەند نموونەیەکمان وەرگرتووە، خوێنەری ئازیز دەتوانێت لەم نموونانەوە بەرچاوڕوونییەکی زیاتری هەبێت و خۆی بەدوای دەیان ناونیشان و سەرەباسی تردا بگەڕێت بۆ ژیانی ڕۆژانەی خۆی سوودیان لێ وەربگرێت.

ئەم نووسینە لەلایەکەوە هەوڵێکە بۆ دانەوەی مشتێك لە کۆگایەکی قەرزاریمان لە ئاست هاوەڵان، هیوایەکیشە بۆ پێشەنگیکردن بە کەسانێکەوە کە بە دەقی قورئان خوای گەورە ڕازیبوونی خۆی بۆیان نیشان داوە، ئاواتێکە بۆ سەرهەڵدانەوەی نەوەیەکی نوێی موسڵمان کە بتوانن جارێکی دی پەیامی خوا لە دڵ و واقیع و خاکی سەرزەویدا پیادە بکەن.

## عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف(رضي الله عنه)

ناوی عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفی کوڕی عەبدعەوفی قوڕەیشی زوهریە، کونیەکەی ئەبوومەحەممەدە، دایکی ناوی شیفائی کچی عەوفە.

یەکێکە لە دە موژدەپێدراوانی بەهەشت و یەکێکیشە لە شەش هاوەڵی شوورای سەردەمی پێشەوا عومەری کوڕی خەططاب، پێغەمبەر ﷺ تا وەفاتی کرد لێی رازی بوو.

عەبدوڕەحمان سەرەتا ناوی عەبدعەمر یان عەبدولکەعبە بوو، بەڵام کە موسڵمان بوو پێغەمبەر ﷺ ناوی نا عەبدوڕەحمان.

عەبدوڕەحمان دە ساڵ لە پێغەمبەر ﷺ بچوکتر بوو، چونکە دە ساڵ پاش ساڵی فیل لەدایك بوو.

**موسڵمانبوونی:** موسڵمانبوونی عەبدوڕەحمان هاوکات بوو لەگەڵ موسڵمانبوونی عوثمانی کوڕی مەظعوون و عوبەیدەی کوڕی حارث و ئەبووعوبەیدەدا، ئەمەش پێش ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بچێتە ماڵی ئەرقەم و لەوێ بانگەواز بکات، عەبدوڕەحمان هاودەم بەو هاوەڵانەی چوونە خزمەت پێغەمبەر ﷺ پێغەمبەری خوا ﷺ باسی ئیسلامی کرد بۆیان و وردەکاریەکانی ئیسلامی خستەڕوو بۆیان، ئەوانیش موسڵمان بوون.

عەبدوڕەحمان یەکێکە لە بەشداربوانی کۆچی حەبەشەو لە هەردوو کۆچەکەدا بەشداری کرد، دواتر گەڕایەوە بۆ مەککەو لەوێوە کۆچی کرد بۆ مەدینە.

کاتێك پێغەمبەر ﷺ لە مەدینە برایەتی خستە نێوان کۆچەران و پشتیوانانەوە، برایەتی خستە نێوان سەعدی کوڕی ڕەبیع و عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفەوە.

عەبدوڕەحمان کە سەرەتا هاتە مەدینە کەسێکی هەژار و نەدار بوو، هیچی نەبوو.

سەعد کەسێکی دەوڵەمەند بوو، بە عەبدورەحمانی وت ماڵەکەم لەگەڵتدا دووکەرت دەکەم و ژنێکیشت لێ مارە دەکەم، ئەویش وتی خوای گەورە بەرەکەت بخاتە ژن و ماڵتەوە، رێی بازارم نیشان بدەن. حارث لە غەزای بەدریشدا بەشداری کرد، عەبدورەحمان دەڵێت لە بەدردا لە ریزدا وەستابووم، تەماشای راست و چەپی خۆم کرد، دوو منداڵی پشتیوانانم بینی، یەکێکیان وتی مامە گیان ئەبووجەهل دەناسیت؟ وتم بەڵێ، بۆچیتە برازاکەم؟ وتی بیستوومە قسەوی وتووە بە پێغەمبەر ﷺ سوێند بەوەی گیانمی بەدەستە ئەگەر ببینم وازی لێ ناهێنم تا دەیکوژم یان دەمکوژێت، ئەوی تریش هەمان شتی پێ وتم، منیش نیشانم دان و ئەوانیش کوشتیان و دواتر هاتنەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ فەرمووی کامتان کوشتی؟ هەرکامیان وتی من، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی کەستان شمشێرەکەتان سڕیوە؟ وتیان نا، سەیری هەردوو شمشێرەکەی کرد و فەرمووی هەردووکتان کوشتووتانە.

حارث دەڵێت کاتێك پێغەمبەر ﷺ لە شیوەکە بوو سەبارەت بە عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف پرسیاری لێکردم و هەواڵی ئەوی پرسی، منیش وتم وا لە لاپاڵی شاخەکەوەیە، بینیم دەستەیەکی دوژمن هاتبوون بۆی و منیش ویستم بچم بۆ پاڵپشتی ئەو، بەڵام کە تۆم بینی هاتم بۆ لای تۆ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: (ألا إن الملائكة تقاتل معه)، (چاك بزانە فریشتەکان لەگەڵ ئەودا دەجەنگن و پاڵپشتی دەکەن)، حارث دەڵێت منیش گەڕامەوە بۆ لای عەبدوڕەحمان و بینیم لە نێو حەوت لاشەی کوژراودایە، پێم وت نەناڵیت هەموو ئەمانەت کوشت؟ وتی ئەمەیان ئەرطهئەی کوڕی شورەحبیل کوشتی، ئەم دوانەش من کوشتنم، بەڵام ئەمانەی تر بەدەستی کەسانێك کوژران کە نەمدەبینین، منیش وتم خوای گەورە پاشان پێغەمبەرەکەی ﷺ راستیان فەرموو.

عەبدوڕەحمان لە غەزای بەدردا برینی زۆری تووش بوو، نزیك بە بیست پێکان و برین بە جەستەیەوە بوو و قاچی تووشی شەلینێك کرد.

سائیبی کوڕی ئەبی حوبەیش دەڵێت لە غەزای بەدردا کابرایەکی قژ درێژ باڵابەرز بەسەر ئەسپێکەوە منی بەدیل گرت و منی بەستەوە، دواتر عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف هات و وتی کێ ئەمەی بەند کرد؟ کەس نەبوو وەڵامی بداتەوە، ئەویش سائیبی برد بۆ لای پێغەمبەر ﷺ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی یەکێك لە فریشتەکان تۆی بەدیل گرت، پاشان فەرمووی ئەی کوڕی عەوف دیلەکەت ببە.

پێغەمبەر ﷺ لە ساڵی شەشەمی کۆچیدا عەبدوڕەحمانی کرد بە ئەمیری سریەیەك و ناردی بۆ دەومەتەلجەندەل و فەرمانی پێکرد ئەگەر موسڵمان بوون ئەوە کچی پاشاکەیان بەهاوسەر بگرێت، ئەوانیش موسڵمان بوون و عەبدوڕەحمانیش کچەکەی پاشاکەیانی بەهاوسەرگرت کە ناوی تەماضوری کچی ئەصبەعی کەلبی بوو.

لە ڕێککەوتنی حودەیبیەشدا بەشداری کرد و یەکێك بوو لە شاهیدەکانی ڕێککەوتنەکە.

عەبدوڕەحمانی کوڕی عوف یەکێکە لە موژدەپێدراوانی بەهەشت، پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو (أبو بكر في الجنة، وعمر في الجنة، وعثمان في الجنة، وعلي في الجنة، وطلحة في الجنة والزبير في الجنة، وعبد الرحمن بن عوف في الجنة، وسعد في الجنة، وسعيد في الجنة، وأبو عبيدة بن الجراح في الجنة)، (ئەبووبەکر لە بەهەشتە، عومەر لە بەهەشتە، عوثمان لە بەهەشتە، عەلی لە بەهەشتە، طلحە لە بەهەشتە، زوبەیر لە بەهەشتە، عەبدورەحمانی کوڕی عەوف لە بەهەشتە، سەعد لە بەهەشتە، سەعید لە بەهەشتە، ئەبووعوبەیدەی کوڕی جەراح لە بەهەشتە). جارێك موغیرە لای سەعیدی کوڕی زەید قسەی بەرامبەر بە عەلی کوڕی ئەبووطالیب کرد، سەعید هەستاو وتی من شایەتی دەدەم بیستم لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو (عشرة في الجنة: النبي في الجنة، وأبو بكر في الجنة، وعمر في الجنة، وعثمان في الجنة، وعلي في الجنة، وطلحة بن عبيد الله في الجنة، والزبير بن العوام في الجنة، وسعد بن مالك في الجنة، وعبد الرحمن بن عوف في الجنة)، (دە کەس لە بەهەشتدان: پێغەمبەر ﷺ لە بەهەشتدایە، ئەبووبەکر لە

بەهەشتدایە، عومەر لە بەهەشتدایە، عوثمان لە بەهەشتدایە، عەلی لە بەهەشتدایە، طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵا لە بەهەشتدایە، زوبەیری کوڕی عەووام لە بەهەشتدایە، سەعدی کوڕی مالیك لە بەهەشتدایە، عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف لە بەهەشتدایە)، ئینجا زەید وتی بمویستایە کەسی دەیەمیشم دەوت، وتیان کێیە؟ بێدەنگ بو، دواتر زۆریان لێکرد تا بیلێت، ئەویش وتی سەعیدی کوڕی زەید-واتە خۆی.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ لە دوای عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفەوە نوێژی کردووە، ئەو فەزڵەش خوای تعالی تەنها بە ئەبووبەکری صدیق و عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفی بەخشی، موغیرەی کوڕی شوعبە دەڵێت لە سەفەرێکدا لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بووین، دەمی بەیان پێغەمبەر ﷺ لە خەڵکەکە دوورکەوتەوەو منیش بەدوایدا چووم و لە دووریەوە چاوەڕوان بووم، کە هاتەوە فەرمووی کارت هەبوو ئەی موغیرە؟

وتم نا، فەرمووی ئایا ئاوت پێیە؟ وتم بەڵێ، دەستنوێژێکی تەواوەتی گرت و مەسحی سەر خوفەکانی کرد، کە گەیشتینەوە بە خەڵکەکە نوێژ دابەسرابوو، عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف بەرنوێژی دەکرد،

رکاتێکی کردبوو و لە رکاتی دووەمدا بوو، ویستم بڕۆم بە عەبدوڕەحمان بڵێم دەست هەڵگرێت ئەوە پێغەمبەری خوایە ﷺ بەڵام پێغەمبەر ﷺ ڕێگری لێکردم، ئێمەش ئەو رکاتەمان لە دوایەوە کرد و دوای سەلامدانەوەی عەبدوڕەحمان رکاتەکەی ترمان تەواو کرد.

ئیبن کەثیر دەڵێت ئەوەش لە غەزای تەبووکدا بوو.

عەبدوڕەحمان زۆر جار لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ بوو و بۆ دەرچوون و هەڵسوکەوتەکانی لەگەڵیدا بوو، بۆ نموونە جارێك سەعدی کوڕی عوبادە نەخۆش بوو، پێغەمبەر ﷺ هاودەم بە عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف و سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص و عەبدوڵای کوڕی مەسعوود هات بۆ لای تا سەردانی بکات.

عەبدوڕەحمان دەڵێت جارێك چوومە مزگەوت و پێغەمبەر ﷺ لەوێ نەبوو، منیش کەوتمە دوای پێغەمبەر ﷺ تا بینیم چوویە ناو باخە خورمایەك و ڕوویکردە قیبلەو سوجدەیەکی دوورودرێژی برد، منیش وەستابووم، وامزانی وەفاتی کردووە، چوم بەرەو لای، سەرم نزم کردەوەو سەیرێکی دەموچاویم کرد، پێغەمبەر ﷺ سەری بەرز

کردەوەو فەرمووی چیە ئەی عەبدوڕەحمان؟ وتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە سوجدەکەت درێژ کردەوە ترسام وەفاتت کردبێت بۆیە هاتم تەماشام کردیت، فەرمووی: (إني لما دخلت النخل لقيت جبريل، فقال إني أبشرك أن الله يقول من سلم عليك سلمت عليه، ومن صلى عليك صليت عليه)، (من کە هاتمە ناو باخە خورماکە گەیشتم بە جیبریل و ئەویش فەرمووی موژدەت پێدەدەم خوای تعالى دەفەرموێت هەرکەس سەلامت لێ بکات سەلامی لێدەکەم و هەرکەس صەلەواتت لەسەر بدات صەلەواتی لەسەر دەدەم).

هەروەها لەکاتی وەفاتی ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەری خوادا ﷺ عەبدوڕەحمان لە نزیك پێغەمبەری خواوە ﷺ بوو، ئەنەس دەڵێت لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ چووم کە بەرەو لای ئیبراهیم دەچوو، لە رێدا ئەبوو سەیفمان بینی کە کوورەی ئاسنگەریەکەی تاو دەدا،ماڵیش پڕ دووکەڵ بوو، منیش لەبەردەم پێغەمبەردا ﷺ خێراتر هەنگاوم هەڵنا و گەیشتمە لای ئەبوو سەیف و پێم وت ئەی ئەبووسەیف دەست هەڵگرە وا پێغەمبەر ﷺ هات، ئەویش دەستی هەڵگرت.

پێغەمبەر ﷺ داوای ئیبراهیمی کرد و گرتیە کۆش و لەخۆی گوشی و چەند جار فەرمووی (ماشاء الله)، ئیبراهیمیش خەریکبوو گیانی دەدا، چاوەکانی پێغەمبەریش ﷺ فرمێسکیان دەڕشت، فەرمووی: (تدمع العين ويحزن القلب و لا نقول إلا ما يرضي الرب و إنا بك يا إبراهيم لمحزونين) (چاو فرمێسك دەڕژێ و دڵ خەمبار دەبێ، هیچیش ناڵێین جگە لەوەی پەروەردگار پێی رازی بێت، ئەی ئیبراهیم ئێمە زۆر دڵگرانین بۆت)، عەبدورەحمانی کوڕی عەوفیش کە بینی پێغەمبەری خوا ﷺ دەگری وتی تۆیش ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (يا إبن عوف إنها رحمة)،(ئەی کوڕی عەوف ئەوە سۆزو رەحمە).

جارێك عەبدورەحمانی کوڕی عەوف نیوەی سامانی خۆی هێنا بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و وتی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە نیوەی سامانەکەمەو هێناومە بۆت و نیوەکەی تریم هێشتوەتەوە بۆ ماڵ و منالم، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: (بارك الله لك فيما أعطيت و ما أبقيت)، (خوا بەرەکەت بخاتە ئەوەی بەخشیوتەو ئەوەشی هێشتووتەتەوە)، ئەوەبوو دووڕووەکان بە لاچاو بە تانەوە سەیریان دەکرد و دەیانوت بەس لەبەر رووپاماییی و حەزی ناوبانگ بەخشیویەتی، ئینجا یەکێك لە موسڵمانە هەژارەکان هات کە ناوی حەبحاب بوو وتی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من ئەمڕۆ بە دوو بەش خورما کرێکاریم کردووە، بەشێکیم (مشتێك) داناوە بۆ ماڵ و منداڵم و ئەم مشتەشم هێناوە، دووڕووەکانیش بە لاچاو سەیریان دەکرد و تانەیان لێدەدا و وتیان خوا و پێغەمبەرەکەی بێباکن لە مشتەکەی ئەبی عەقیل، ئەوەبوو خوای گەورە ئایەتی دابەزاند (الذين يلمزون المطوعين من المؤمنين في الصدقات والذين لا يجدون الا جهدهم

فیسخرون منهم سخر الله منهم ولهم عذاب الیم) ئەوەش وەڵامێك بوو بۆ دووڕووەکان.

جارێك عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و سکاڵآی لە خالید کرد، پێغەمبەریش ﷺ بە خالیدی فەرموو (ئەی خالید بۆچی ئازاری کەسێك لە بەشداربوانی بەدر دەدەیت؟ خۆ ئەگەر هێندەی ئوحود زێڕ ببەخشیت ناگەیتەوە بە کردەوەی ئەودا)، خالیدیش وتی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ سەر دەنێنە سەرم و قسەم لەرووداکەن، منیش ناچار دەبم وەڵامیان بدەمەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (لا تؤذوا خالدا فإنه سیف من سیوف الله صبه الله علی الکفار)، (ئازاری خالید مەدەن، چونکە ئەو شمشێرێکە لە شمشێرەکانی خوای تعالی کە بەرووی بێباوەڕاندا هەڵیکردووە).

پاش وەفاتی پێغەمبەر ﷺ عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف یارمەتی زۆری خێزانەکانی پێغەمبەری خوای ﷺ دەدا و پارەیەکی زۆری دابەش دەکرد بەسەریاندا.

دایکی ئیمانداران عائیشە الله لیی ڕازی بێ دەفەرمویت: لە ساڵی قات و قڕی و برسیتی لە سەردەمی ئیمام عومەردا خەڵکی شاری مەدینە برسی بوون.

ئەڵی ماڵەکەی من تەنها چەند خورمایەکی تیا بوو، ویستم سەر خەویک بشکینم لە ناکاو دەنگە دەنگی هات منیش جویریەم لا بوو وتم هەستە بڕۆ بزانە ئەوە چیە ئەڵیت ڕۆشت و هاتەوە وتی: ئەوە کاروانی عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفە لە شامەوە هاتوتەوە بارەکەی هەمووی پڕە لە خۆراک وەک (زەیت و نان و برنج وگەنم) بازرگانەکان و دوکاندارەکانی مەدینە ئەیانەوی لیی بکڕن کاروانەکە بریتە لە ٧٠٠ ووشتر و چەندین بەرامبەر نرخی خۆی زیاتری پی دەدەن ئەویش نایفرۆشی ئەڵی نایدەم.

عائیشه دەفەرمویت: (گومانی خراپم برد) وتم یانی چی چۆن نایفرۆشی بەو خەڵکه ئایا هاوەڵەکانی خراپ دەرچوون، ئەڵی زۆری پی نەچوو جاریەکەم هات وتی ئەوە عبدالرحمنی کوڕی عەوفه لەبەر دەرگایه بانگت دەکات منیش وتم ئوخەی خۆی هات ئیستا پیی دەڵیم بۆچی وا دەکات، ئەڵی ڕۆشتمه پشت دەرگاکه وتم فەرموو: ئەی کوڕەکەی عه وف ئەویش فەرمووی ئەی دایکی ئیماندارران له بیرته پیغەمبەر ﷺ فەرمووی هەمومان دەڕۆینه بەهەشت ئیلا عەبدوڕەحمانی نەبێت لەسەر ماڵ و سامانی لیپیچینەوەی لەگەڵ دەکری دوایی به خۆشەویستی و پاکی دەڕواته بەهەشت و قبوڵ دەبیت.
ئەو بازرگانانه ٥ هینده زیاتری نرخەکەی خۆی ئەدەن من وتم ١٠زیاتری نرخەکەیم پیدراوه کەسیان نەیان توانی ئەوەنده بدەن بۆ یەک چاکه و خیر لای الله تعالی به ١٠ بەرامبەره و زیاتره.
ئینجا دایکه عائیشه دەفەرمویت گەڕامەوه ژوورەکەم خەفەتم خوارد که گومانی خراپم بەو برد، ئەڵی والله هەموو کاروانەکەی کرده خیر

منیش ڕۆشتمە دەرەوە تا ببینم بە چاوی خۆم بینیم ئیمام عومەر و علی و هاوەڵان دابەشیان دەکرد واللە یەک برسی نەما ئەو ڕۆژە لە مەدینە.

پێشەوا ئەبووبەکری صدیق دژبە هەڵگەڕاوەکان جەنگی ڕاگەیاند، بۆ ئەوەش مەترسی لەسەر مەدینە دروست دەبوو، بۆیە پاسەوانی شەوانەی بە دەوری مەدینەدا دانا و بڕێك کەسی کرد بە ئەمیری دەستە دەستەی ئەو پاسەوانانە، لەوانەش عەلی کوڕی ئەبوو طالیب و زوبەیری کوڕی عەووام و عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف و طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵا و سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص و عەبدوڵای کوڕی مەسعوود.

عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف لە سەردەمی هەریەك لە ئەبووبەکری صدیق و عومەری کوڕی خەططابدا فەتوای دەدا.

لە ساڵی سیانزەی کۆچیدا عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف پێشەنگی مەراسیمی حەجی کرد بۆ خەڵك.

کاتێك پێشەوا ئەبووبەکری صدیق نەخۆش کەوت، عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفی بانگ کرد و وتی هەواڵی عومەرم پێ بدە، ئەویش وەسفی کرد و وتی بەڵام توندیەکی تێدایە، ئەبووبەکر وتی ئەوە لەبەرئەوەیە کە منی دیوە نەرم بوم بۆیە، ئەگەر خۆی بێت زۆرێك لەوەی هەیەتی واز لێدێنێت.

لە سەردەمی پێشەوا عومەری کوڕی خەططابدا کاتێك عومەری کوڕی خەططاب ویستی بەخششی خەڵك دیاری بکات، ڕاوێژی کرد بە عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف و عەلی کوڕی ئەبووطالیب، ئەوانیش وتیان لە خۆتەوە دەست پێ بکە، چونکە تۆ شیاوتریت بەوە، عومەریش وتی نا سوێند بە خوای تعالی لە نزیکترین کەسەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ دەست پێ دەکەم،

ئینجا لەوانەی بەشداری بەدر بوون، بەوجۆرە دەچم تا دەگاتە خۆم، یەکەمجار پێنج هەزاری بڕیەوە بۆ عەلی کوڕی ئەبوو طالیب، دواتر بۆ هاشمیە بەشداربووەکانی بەدر.

جارێك کاروانێکی بازرگانی هاتنە مەدینە، پێشەوا عومەری کوڕی خەططاب کە خەلیفە بوو بە عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفی وت با ئەمشەو پاسەوانی ئەمانە بکەین، ئەویش وتی باشە، ئەو شەوە عومەرو عەبدوڕەحمان پێکەوە پاسەوانی ئەو کاروانەیان کرد، منداڵێك بەردەوام دەگریا، پێشەوا عومەر بە دایکی وت لەخوای تعالی بترسە وریای منداڵەکەت بە، کەچی منداڵەکە هەر دەگریا، چەند جارێك پێشەوا عومەر ئەوەی وت بە دایکی، دواجار دایکی هاتە جواب و وتی ئەمەوێت لەشیری ببڕمەوە، بەڵام بیری ناچێتەوە، عومەر وتی بۆ وا دەکەیت؟ وتی ئاخۆ عومەر تەنها بۆ کەسێك بەشی بڕیوەتەوە کە شیرەخۆرە نەبێت، عومەر وتی ماڵوێران پەلە مەکە لە شیربڕینەوە، ئەوەبوو بۆ بەیانی بڕیاری دا هەر منداڵێك لەدایك بوو هەر لە لەدایکبوونیەوە بەشی بۆ ببڕێتەوە.

سائیبی کوڕی یەزید دەڵێت لە سەردەمی پێشەوا خیلافەتی عومەری کوڕی خەططابدا ئێمە لە رێی حەجدا بەرەو مەککە دەچووین و عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفیشمان لەگەڵدا بوو، عەبدوڕەحمان کەناری گرت لە رێگەکەو بە رەباحی وت ئەی ئەبووحەسسان کەمێك گۆرانیمان بۆ بڵێ، چونکە رەباح دەنگێکی خۆشی هەبوو، ئەویش دەستی پێکرد، لەو کاتەدا عومەری کوڕی خەططاب هات و وتی ئەمە چیە؟ عەبدورەحمان وتی کێشەیەك نیە دەمانەوێت رێگەکەمان لێ بڕوات، عومەریش وتی هەر دەیڵێیت ئەوا شیعرەکەی ضیراری کوڕی خەططاب بڵێ.

لە کۆتا حەجی پێشەوا عومەری کوڕی خەططابدا عەبدوڕەحمانیش بەشدار بوو، بیستی کەسێك دەیوت ئەگەر عومەر مرد من بەیعەت بە فڵانە کەس دەدەم، عەبدوڕەحمانیش بە خەلیفەی وت چی روویداوە، پێشەوا عومەر وتی دوای عەسر پشت بەخوا روونکردنەوە دەدەم بەو خەڵکە، عەبدوڕەحمان وتی ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەوە مەکە، چونکە ئێستا هەمەچەشنە خەڵك هاتون و لەوانەیە قسەیەك بکەیت کە وەك

خۆی وەرینەگرن، بەڵام کە چوویتەوە مەدینە قسەی خۆت بکە، پێشەوا عومەریش راکەی عەبدوڕەحمانی وەرگرت.

لەو نوێژەدا کە عومەری کوڕی خەططاب پێکرا، خێرا فەرمانی کرد عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف نوێژەکەی بۆ خەڵکەکە کرد، پاشان عەبدوڕەحمانی بانگ کرد و وتی دەمەوێت تۆ راسپێرم بۆ باری دەسەڵاتی دوای خۆم، عەبدوڕەحمان رازی نەبوو، عومەر وتی دەی ئەم ماوە بێدەنگ بە تا ئەو کەسانە راسپێرم کە پێغەمبەر ﷺ تا وەفاتی کرد لێیان رازی بوو.

پێشەوا عومەری کوڕی خەططاب پاش ئەوەی پێکرا، شەش کەسی راسپارد تا لەنێو خۆیاندا کەسێك دیاری بکەن بۆ خیلافەت، ئەوانیش بریتی بوون لە عەلی کوڕی ئەبوو طالیب، عوثمانی کوڕی عەففان، طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵا، زوبەیری کوڕی عەووام، سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص، عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف.

پێشەوا عومەری کوڕی خەططاب ئەگەری دانا بۆ درووستبوونی راجیایی لەسەر دیاریکردنی کەسێك و چارەسەری بۆ داناو وتی ئەگەر سێ کەس سێ کەس کەوتن (واتە بوون بە دوو بەشەوە) ئەوە عەبدوڵای کوڕی عومەر بکەن بە دادوەری نێوانیان، ئەگەریش بە دادوەری ئەو رازی نەبوون، ئەوە لەگەڵ ئەو دەستەیە بن کە عەبدورەحمانی کوڕی عەوفی تێدایە.

ئەوەبوو دواجار سیانیان وازیان هێنا لە مافەکەیان بۆ ئەوانی تر، مانەوە سەر عەبدورەحمان و عەلی و عوثمان، عەبدورەحمان وتی منیش لە پێناو خوادا واز لە مافەکەم دێنم و ئێوەش یەکێکتان وازبهێنن تا بەیعەت بدەین بەوی تر، دواجار ئەهلی شوورا بڕیاری کۆتاییان دایە دەست عەبدورەحمان، ئەویش کەوتە وەرگرتنی رای خەڵکی و تەنانەت رای ژن و منداڵیشی وەرگرت، رای سوارەو پیادەکانیشی وەرگرت، سێ شەو و رۆژ بەردەوام بوو لەو راوەرگرتنەی، رای زۆرینەی هەرەزۆر لەسەر عوثمانی کوڕی عەففان بوو، دواجار لەبەری بەیاندا مێزەرەکەی پێغەمبەری خوای ﷺ کردە سەر و ناردی بە شوێن

ناودارانی ناو کۆچەران و پشتیوانان و خەڵکی ترداو مزگەوت پڕ بوو لە خەڵك، چوویە سەر مینبەرەکەی پێغەمبەر ﷺ و ماوەیەکی زۆر وەستا و بە دەنگی نزم نزایەکی زۆری کرد، دواتر خەڵکەکەی دواند، ئینجا عەلی بانگ کرد و دەستی گرت و وتی لەسەر قورئان و سوننەتی پێغەمبەرەکەی و کرداری ئەبوبەکر و عومەر بەیعەتم پێدەدەیت؟ وتی ناوەڵا، بەڵکو هێندەی توانام هەبێت، عەبدوڕەحمان دەستی بەردا و عوثمانی بانگ کرد و دەستی گرت و هەمان شتی بەویش وت، عوثمان وتی بەڵێ بەخوای تعالی، ئەوەبوو عەبدوڕەحمان لە شوێنەکەی پێغەمبەر ﷺ دانیشت و عوثمانیش لە پلیکانەی خوارترەوەو خەڵکەکە هاتن بەیعەتیان دا بە عوثمانی کوڕی عەففان و عەلی کوڕی ئەبووطالیبیش بەیعەتی پێدا.

جا بڕێك دەق هاتون کە عەلی کوڕی ئەبووطالیب بەو بڕیارە ناڕازی بووبیت و ئەوەی بە فێڵ دانابێت، ئیبن کەثیر دەڵێت: (ئەوەی زۆرێك لە مێژوونووسانی وەك ئیبن جەریر و کەسانێکی تر لە بڕێك کەسی نەناسراوەوە تۆماریان کردووە گوایە عەلی بە عەبدوڕەحمانی وتووە تۆ منت خەڵەتاند و تۆ لەبەر خزمایەتی و لەپێناو ئەوە عوثمانت دانا تا لە هەموو شتێکدا رات وەربگرێت و...هەموو ئەمانە پێچەوانەی تۆماری صەحیح و دروستن و دەدرێنەوە بە رووی خاوەنەکانیاندا).

لە سەردەمی عوثمانی کوڕی عەففاندا عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف هاودەم بە موسڵمانان بەیعەتی دا بە عوثمانی کوڕی عەففان و گوێرایەڵ و کەسی نزیکی بوو، هاوکات خەلیفەش رێز و گەورەیی ئەوی دەزانی و دەیوت ئێستا کەس نیە فەزڵی لەو پیاوە زیاتر بێت لەبەرئەوەی بەشداری هەردوو کۆچەکە بوو.

جارێك طەلحە نەخۆش کەوت و جۆرێك لە عاجزی لەنێوان ئەو و عەبدوڕەحماندا هەبوو، عەبدوڕەحمان چوو بۆ لای، طەلحە وتی براکەم بەخوا تۆ زۆر لە من باشتریت، عەبدوڕەحمان وتی براکەم وامەڵێ، ئەویش وتی بەرێ وەڵا، چۆن وا نەڵێم، ئەگەر تۆ نەخۆش بکەوتیتایە من دەهاتم بۆ سەردانت؟!

جارێك عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف وەسیەتی کرد چی بەشداربووی بەدر ماون دیاری بکرێن تا هاوکارییان بکات، تەنها سەد کەس مابوون، بۆ هەرکامیان چوارسەد دیناری پێ بەخشی، تەنانەت بەشی عوثمانی کوڕی عەففانیشی دا، چونکە ئەو هەرچەندە بەشدار نەبوو بەڵام پێغەمبەر ﷺ کاتی خۆی بە بەشداربووی بەدر حسابی کردبوو.

جارێك عەبدوڕەحمان دانیشتبوو خواردنی بۆ هێنرا، وتی موصعەبی کوڕی عومەیر کوژرا و زۆر لە منیش باشتر بوو و تەنها عەبایەك هەبوو بۆ کفنەکەی، حەمزەش کوژرا و لە من زۆر باشتر بوو و ئەویش تەنها عەبایەك هەبوو بۆ کفنەکەی، دەترسم خۆشیەکان بۆ ئێمە خرابنە دنیا و لەو دنیا بێبەش بین، ئیتر دەستی کرد بە گریان.

لە گێڕانەوەیەکدا هاتووە کە عوثمانی کوڕی عەففان نووسراوێکی نووسی تا عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف دوای خۆی ببێت بە خەلیفە، کاتێك عەبدوڕەحمان ئەوەی بیست چوویە نێوان مینبەرو گۆڕەکەی پێغەمبەر ﷺ و نزای کرد خوایە ئەگەر بڕیاری وا هەیە ئەوا پێش ئەو بارە بممرێنە، ئەوەبوو شەش مانگی نەخایاند کە عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف وەفاتی کرد.

عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف لە ساڵی سی و دووی کۆچی و لە تەمەنی حەفتا و پێنج ساڵیدا لە مەدینە کۆچی دوایی کرد و لە گۆڕستانی بەقیع ئەسپەردە کرا.

کاتێك وەفاتی کرد عوثمانی کوڕی عەففان نوێژی لەسەر کرد. عەبدوڕەحمان پاش خۆی سامانێکی زۆر زۆری بەجێهێشت، پاش مەرگی نزیکەی هەزار وشتر و سێ هەزار مەڕو سەد ئەسپی جێهێشتبوو، لە میراتەکەی هەر ژنێکی سەد هەزاری بەرکەوت.

## کۆتایی

هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ دەستەی هەڵبژێردراو بوون بۆ وەرگرتنی پەیامی الله تعالی و بەجێگەیاندنی لەبەردەستی سەروەرماندا و ئەزموونکردنی لە دوای وەفاتی خۆشەویستمان، لەوەشدا نموونەی باڵا بوون و توانییان الله لە خۆیان ڕازیی بکەن و دەقەکانی قورئان و فەرموودە ئەستۆپاکییان بسەلمێنن.

جێی سەرنج بوو بۆم کەسانێك کە توانیبێتیان الله تعالی لە خۆیان ڕازیی بکەن، بتوانن کۆتا پەیام لە کۆتا پێغەمبەرەوە ﷺ وەربگرن و بە ئەمانەتەوە بیگەیەنن بە مرۆڤایەتی و ئەمڕۆ ئێمە لەسەر بنەمای ئەو هەنگاوەی ئەوان سەرقاڵی دینداریی بین، دەکرێت چەند وانەیەکیان لێوە فێر ببین بۆ ژیانمان، بەڵکو ئێمەش بتوانین وەك ئەوان الله لە خۆمان ڕازیی بکەین و خزمەتێك بە نەوەی دوای خۆیشمان بکەین.

ئێمە بە دەقی قورئان ڕێنمایی کراوین پێشەنگیی بکەین بە پێغەمبەرانی خواوە ﷺ، وەك لە قورئاندا هاتووە (فَبِهُدَاهُمُ اقْتَدِهِ)، هەروەها ڕێنمایی کراوین پێشەنگی بە کۆتا پێغەمبەرەوە بکەین ﷺ (لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ)، هاوەڵان یەکەم نموونە بوون کە توانییان ئەم پێشەنگییانە جێبەجێ بکەن و خوای گەورەش شایەتییان بۆ بدات و لێیان ڕازیی بێت، واتە براوە بون، دەبێت ئێمەش پێشەنگیمان بە هاوەڵانەوە هەبێت و لە شێوازی ژیان و هەڵسوکەوتیان وردبببینەوە، بزانین چۆن توانییان پاش وەفاتی پێغەمبەری خوا ﷺ درێژە بە پەیامەکە بدەن و دینی الله تعالى بگەیەنن بە سەرجەمی مرۆڤایەتیی؟ ئاکار و ڕەفتاریان چۆن بوو؟

ئەگەر بتوانین لە ژیانی هاوەڵان و هۆکاری بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوا لەلایەن ئەوانەوە بکۆڵینەوەو بگەینە ئەنجام، پاشان هەمان ڕێڕەو لە ژیانماندا بگرینەبەر، پشتیوان بە الله تعالى ئێمەش دەتوانین بگەین بە ڕەزامەندیی پەروەردگار.

فنسأل الله عز وجل أن يعجل فرج هذه الأمة اللهم أقم علم الجهاد واقمع أهل الزيغ والفساد وانشر رحمتك على العباد. يا من له الدنيا والآخرة وإليه المعاد وصلى الله وسلم وبارك على عبده ورسوله نبينا محمد وعلى آله وأصحابه أجمعين.

# سەرچاوە

- البداية و النهاية لابن كثير.

- الإصابة في تمييز الصحابة

- العواصم من القواصم.

- أسد الغابة، ج٣، ص ٦١٦.

- سير أعلام النبلاء للذهبي

- الطبقات الكبرى لابن سعد،

- الإستيعاب في معرفة الأصحاب،

- المعجم الكبير للطبراني،

- السيرة النبوية لابن هشام